

دکتۆر عەلی ئەلوەردی

# کێشەی شیعەو سوننە

## کورتە باسێکی مێژوویی

وەرگێڕانی
عارف کەریم

دکتۆر عەلی ئەلوەردی

# کێشەی
# شیعەو سوننە

## کورتە باسێکی مێژوویی

وەرگێڕانی
عارف کەریم


ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران
سلێمانی - ٢٠١١

کێشەی شیعە و سوننە - کورتە باسێکی مێژوویی

نوسینی: دکتۆر عەلی ئەلوەردی

وەرگێڕانی: عارف کەریم. ستۆکهۆلم

بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

سلێمانی - ٢٠١١

ژمارەی سپاردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

(١٨٤٩) ساڵی ٢٠١١

لە دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی چاپکراوە

دیزاین: ئەمیرە عومەر

تایپ: سوهەیلە عبدالوهاب

تیراژ: (١٠٠٠)

ژمارەی زنجیرە: (٤٠٤)

www.pukhoshiari.com

info@pukhoshiari.com

## ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

دامەزراوەیەکی کەلتورییە بەپێی بڕیاری کۆنگرەی سێی ساڵی ٢٠١٠ ی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دامەزراوە، ئەرکەکەی بریتییە لەدەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی هۆشیارکردنەوەی سیاسی، فراوان کردنی چوارچێوەکانی ڕۆشنبیریی گشتی، تۆکمەکردنی بەهاکانی دیموکراسیو مافی مرۆڤ و دادی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵدا، تاوتوێ کردنی مەسەلەکانی بیری هاوچەرخو دابینکردنی کەرەستەی پێویست بۆ پێگەیاندنی کادیران لە بوارە هەمەجۆرەکاندا.

# پێشەکی

دەمێك بوو لەپاڵ چاوخشاندن بەلاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکاندا، دەگەڕام بەدوای بابەتێك لەشێوەی وتار، لێکۆڵینەوە، توێژینەوە لەسەر کێشەی شیعەو سوننە کە گەورەترین کێشەی سەردەمە لەعێراقدا لەدوای کێشەی کورد، بەتایبەتی ئەمە یەکەمجارە لەمێژووی عێراقدا شیعەکان بەرەسمی هاوبەشی دەکەن لەهەڵبژاردەکانو لیستی یەکەمی سەرکەوتن بەدەست دێننو دەبنە خاوەنی دەسەڵات. بەداخەوە دەڵێم باسێکی مێژوویی چڕو پڕی لەوبابەتە بەرچاوی من نەکەوت بەزووبانی کوردی، ئەوە ناڵێم کە دەیان

کتێبو باس‌و لێکۆڵینه‌وه به‌زووبانی عه‌ره‌بی نوسراون له‌و باره‌یه‌وه.

جگه له‌وه خۆیشم پێویستم به‌هه‌ندێ زانیاری هه‌بوو له‌سه‌ر مه‌زهه‌بی شیعه، سه‌رهه‌ڵدانی مه‌زهه‌به‌که، ڕێبازه‌که‌یان، دروشمه‌کانیان، ئامانجه‌کانیان... تاد ناوبه‌ناویش تێبینی ئه‌وه‌م ده‌کرد هه‌ندێ نووسه‌ر، سوننه‌و سوننی هه‌روه‌ها شیعه‌و شیعی لێك جیاناکه‌نه‌وه‌و تێکه‌ڵ به‌یه‌کیان ده‌که‌ن له‌نووسینه‌کانیاندا.

خۆشبه‌ختانه له‌سه‌فه‌رێکم بۆ ده‌ره‌وه‌ی سوید چه‌ند کتێبێکم کڕی، له‌ناو ئه‌وانه (وعاظ السلاطین)ی دکتۆرعلی الوردی بوو که به‌شی یازده‌ی کتێبه‌که‌ی ته‌رخان کردووه بۆ کێشه‌ی شیعه‌و سوننه. ئه‌م کتێبه ده‌مێکه چاپ کراوه‌و دوای که‌وتنه بازار، کێشه‌ی زۆری لێکه‌وتۆته‌وه‌و به‌لایه‌نی که‌مه‌وه به‌پێنج کتێبی تر وه‌ڵامی دراوه‌ته‌وه. نووسه‌ری کتێبه‌که په‌نای بردۆته

بەر ژمارەیەکی زۆر لەسەرچاوە بۆ نووسینی ئەم بەشە، لەوانە (على الوردی، خوارق اللاشعور ج ١ ص ٨، سيد الاهل، الخليفة الزاهد ص ١٠٣، الزمخشری، الكشاف ج ١ ص ٦٤، لبن حجر، الصواعق المحرقة، ص ٧٢- ١٠٨، الشهرستانی، الملل والنحل ج ١ ص ٧٩ ابو فرج الاصفهانی، مقاتل الطالبين ص ٢٤٧، الخطيب البغدادی، تاريخ بغداد ج ١٣ ص ٣٩٨، ٣٢٨ احمد امين، ضحی الاسلام، ج ٢ ص ١٨٤ ج ٣ ص ٢٨٦ سعد محمد الحسن، المهدية في الاسلام ص ٨٨ جرجی زيدان، التمدن الاسلامي ج ٤ ص ١١٩، محمد برانق، البرامكة في ظل الخلفاء ص ١٢٦ — ١٢٧. محمد حسين الزين، الشيعة في التاريخ ص ١٩٣-٢٢٠.

ئەمانەو دەیان سەرچاوەی تر ناویان هاتووە لەکتێبەکەی دکتۆر عەلی ئەلوەردی کە بەپێویستی نازانم ناوی هەموویان بەرم.

من هەولم داوە بەشی یازدەی کتێبەکە (قضیة الشیعةو السنة) وەربگێڕمە سەر زوبانی کوردی بەدەستکارییەوە. وەرگێڕانەکە هی تەواوی دەقەکە نیەو بازم داوە بەسەر هەندێ برگەدا کە سەرنج ڕاناکێشێت، یاخود جاری واهەبووە چەند دێڕێکم لەبڕگەیەکدا هەلبژاردوەو ئەوانەی ترم خستۆتەلاوە چونکە نەمویستووە لەناوەڕۆکی بابەتەکە لابدەم کە مەسەلەی شیعەو سوننەیەو کارم بەوردەکاری تر نەبووە. مەبەست لەم وەرگێڕانە پێشکەشکردنی هەندێ زانیارییە لەسەر کێشەکە، هیوادارم بەدڵی خوێنەرو ڕەوشەنبیری ئازیز بێت. کێ بزانێ کەسێکی لەمن باشتر پەیدا ببێو پیاداچوونەوەی بەشی یازدەی کتێبی ناوبراو بگرێتە ئەستۆی خۆیو پێشکەشی بکاتەوە بەخوێنەران، یان وەرگێڕانەکەی من هەلسەنگێنێو شەنوکەوی بکاتو بەخامەی ڕەنگینی دەولەمەندی بکاتو هەلەکان ڕاست بکاتەوە بۆ ئەوەی لێوەی فێرببینو سوپاسی بکەین.

ئـەم مەسـەلەیە هـەتا بلێـی ئـاڵۆزە بەتایبـەتی لەعێراقدا، هیچ وڵاتێك ئەوەندەی عێراقی نەچێشتووە بەدەست ئەم مەسەلەیەوە، ئەم دوو تاقمە هەریەکـەیان خـۆی بەڕاسـتتر دەزانـێ لـەویترو بـەلای خۆیـدا دایدەشکێنێ، ئـەوەی پێـی پـەروەردە بـووەو لەسـەری ڕاهاتووە لەداب و نەریت و بیروباوەڕ، هەر ئەوەی بەلاوە گرنگەو دەیلێتەوەو دەیلێتەوە. بەربەرەکانی و پێکەوە هەڵچوونی ئەمانە جێی پێکەنینە لای مـەنتیقی (وتـار، وتە، بەڵگە) کۆمەڵایەتی و بەپێکەوەهەڵچوونی خێڵەکی ناوەزەدی دەکات.

عارف کەریم

ستۆکهۆڵم

٣٠ /٥/٢٠٠٥

# کێشەی شیعەو سوننە

پیاوە ئاینییەکانی سوننە لەسەر بنەمای خێڵەکی ناکۆکیان هەیە، هەرلایە خراپ سەیری لایەکەی تر دەکات. ئەم دوو تایفەیە لەسەرەتادا یەك بوون‌و دوایی دەسەڵاتداران‌و ئامۆژگارییەکانی ئەوان لەیەکی جیاکردنەوە.

لەسەردەمی ئەمەویەکاندا شیعەو سوننە وەکو یەك حزب وابوون، (حزبی شۆڕش) شیعە بەزەبری شمشێرەکانیان شۆڕشیان بەرپا کرد دژی دەوڵەت، کەچی ئەهلی سوننە شۆڕشیان دەکرد بەپشتبەستن بەوتەکانی پەیامبەر. ئەمان بەزوبانیان شتە خراپ‌و ناشیرینەکانیان ڕەتدەکردەوە، ئەوانیتر (شیعە)

بەدەست دەیانکرد. ئەوەی شایانی باسە زاراوەی (اهل السنة والجماعة) لەزەمانی موتەوەکیل دەرکەوت، پێشتر پێیـان دەگـوتن ئـەهلی حـەدیس. حـەدیس‌و سـوننە لەهەندێك رووەوە لەیەك دەچن.

لەسـەردەمی ئەمەویەکانـدا هەرکەسێك (سیرة اهل الحدیث) واتە ئاین‌و وتەکانی پەیامبەر — ی بخوێندایە، خۆی لەبەرەی دوژمن‌و دژ بەلایەکەی تر دەبینیەوە.

لەڕاسـتی دوور ناکەوینـەوە ئەگـەر بلـێین ئـەهلی حـەدیس هێنـدەی شیعەکان دوژمنایـەتی دەولـەتی ئەمـەوییان دەکـرد. ئـەوەی ئـەمانی لەشـیعەکان جیـادەکردەوە ئەوەیـە کەپـەنایان دەبـردە بەرچەکی حـەدیس بۆ بەگژداچوونەوەی زولم‌و زۆرو گەنـدەلی ئەو سەردەمە.

شـۆڕش دووجـۆر چەکی پێویستە، چەکی شمشێرو چـەکی قەلـەم، هـیچ شۆڕشـێك لـەدنیادا نـەیتوانیوە سەرکەوتن بەدەست بهێنێ بەبێ قەلەمی بەهێز (واتـە زوبانی بەهێز) بۆ بلاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی لەنێو

خەڵکیدا چونکە شمشێر بەتەنها بەس نیە بۆ پشتگیریکردن لەبیروباوەڕی شۆڕشگێڕی. ئەگەر عەقڵی ڕاوەستاو دانەماڵی لەخەڵکیو بیری ئەوان نەگۆڕی، ئەوا شمشێر بەتەنها ناتوانێ شۆڕشی سەرکەوتوو بەرپا بکات.

عەباسیەکان جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئەمەویەکانی پێش خۆیان نەبوو لەڕووی خوێن ڕشتنو تالانکردنو گەندەڵیو زۆرداری ئەوان، بەشێوە کەمێك جیاواز بوون، ئەگەرنا هەر نەفرەتیان کردەوە لەئەهلی حەدیسو چەوساندوویاننەتەوە. بەدرۆش فرمێسکیان بۆ هەڵڕشتوون، بەڵام ئەهلی حەدیس بەمانە هەڵنەخەڵەتانو زرنگتر بوون لەوەی فێڵێکی وایان بەسەردا تێپەڕێت. ئەوان لەسەر ڕێبازی خۆیان لایان نەداو داوای شۆڕشیان دەکردو لایەنگری خاوەنەکانیان دەکردو چاکەکانی (عەلی) یان لەگەڵ بیروباوەرە کۆمەلایەتیەکانی ئەودا لەناو خەڵکیدا

بڵاودەکردەوە کە دواتر خۆی و ئەولادەکانی لەپێناویدا ڕاپەڕین.

ئیمامە گەورەو ناسراوەکانی دواسەردەمی ئەمەوی و سەرەتای سەردەمی عەباسی، بەشیعەکردنیان کردبوە ڕێبازێکی سەیرو بەپێی ڕێبازی عەلی و بیروباوەڕەکانی ئەو خەڵکیان کۆدەکردەوەو گوێیان نەدەدایە ئەو زەرفە خراپەی دەوری دابوون.

لەدوای کوشتنی عەلی کوڕی ئەبو تالیب، لەناوچەی کوفە شیعەکان بەهێزبوون و پێیان وابوو کەدەتوانن گیان بکەنەوە بەبەری عەلی دا هەروەها گیانی شۆڕشگێری لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا، بۆ ئەم مەبەستە تائیفەی ئەهلی حەدیس یان لەگەڵدابوو، ئەمانە (ئەهلی شمشێرو ئەهلی قەڵەم) ڕاپەڕین و توانیان دەوڵەتی ئەمەوی لەناوبەرن. دەوڵەتی ئەمەوی حوکمی خۆی بەزەبری شمشێر ڕاگرتبوو، گوێی نەدەدایە قەڵەمو خستبویە لاوە کەبووە هۆی ڕووخانی، بنەمای دروستبوونی دەوڵەتی ئەمەوی بنەمایەکی خێڵەکی

بوو، لەسەر ڕێبازی خەڵکی بیابان دەڕۆشتن و ئەهلی حەدیسیان خستبوە لاوە بەڵام بایەخیان بەشاعیر دەدا وەکوو چۆن خەڵکی بیابان بایەخیان پێدەدا، بەڵام بیریان چووبۆوە کە شاعیری شاریی وەکو شاعیری بیابان نیەو بەرامبەر بەوەی دەیان وت داوای شتیان دەکرد، بگرە زیاتریش، ئەوانە بەلایانەوە گرنگ نەبوو جنێوبدەن بەوەی دوێنێ مەدح و سەنایان کردبوو، هۆش و بیریان لای ماڵی دنیاو پارەوپوول بوو، لەبەر ئەوە کە دەوڵەتی ئەمەوی ڕووخا، هەموو مەدح و سەناکانیش لەگەڵیدا ڕووخاو نەمان.

ئەهلی حەدیس خراپەی ئەمەویەکان و چاکەی دوژمنەکانیانی تۆمارکردوە کە نەوە لەدوای نەوە خەڵك دەیانخوێنێتەوەو بڕوای پێدەهێنن. مێژووی ئیسلام پڕە لەخراپەکاری، ئەمەویەکان و مێژوونوسەکان کەمێك نەبێت باسی چاکەی ئەوانیان نەکردووە.

عەباسیەکان کە دوای ئەمان هاتن بایەخێکی زۆریاندا بەئەهلی حەدیس بەڵام هیچ پیاوێکیان خۆشنەدەویست کە لایەنگری عەلەویەکان و شۆڕشەکەی ئەوانیان دەکرد، بێگۆمان عەباسییەکان شیعە بوون، شیعەچێتی لای ئەوان بۆ (ئەهل ئەلبەیت) بوو کە مەبەست عەلی و ئەولادەکانی بوون، عەباس لای ئەوان پێش عەلی و فاتیمە دەکەوتن، لەمیراتگری پەیامبەردا. مشتومڕەکانی نێوان مەنسوور و محەمەد عەبدوڵڵە ئەلحەسەنی نیشانەو سەرەتایەك بوو بۆ کەرتبوونی هەردوو خێزانیی هاشم کە مەبەست بنەماڵەی عەلی و عەباس بوو، ناکۆکیەکان و شەڕەقسەکان شمشێر وەشاندنی بەدوودا هات و ئیتر لەوکاتەوە پەیوەندیەکان ئاڵۆز و ڕووی لەزیادبوونەو هەر کەڵەکە دەبێت. ئەم ناکۆکیانە لەبنچینەدا ناکۆکی خێزانیی بوون کە دوایی گۆڕدرا بۆ ناکۆکی مەزهەبی، بۆیە توێژەرەوەکان و لێکۆڵەرەوەکان ناتوانن دیراسەی سەرهەڵدانی ناکۆکی و ململانێکانی نێوان شیعەو سوننە بکەن ئەگەر نەچنە

نـــاو قـــوولایی پێـــشبڕکێو نـــاکۆکی خێزانـــیو هەڵسەنگاندنی لایەنە فیکریو کۆمەڵایەتیەکانی.

ئەم دوژمنایەتیە لەسەروەختی ڕەشیددا پەرەیسەند، ئەو پێش ئەوەی خەلافەت بگرێتە دەست بەتوندی ڕقی لەعەلەویەکانو شیعەچێتی ئەوان بوو.

یەکێك لەشاعیرەکانی ئەو سەردەمە پەنای بردە لای بەرمەکیەکان بۆ ئەوەی نزیکی بخەنەوە لەخەلیفە ڕەشید تا شتێکی دەست بکەوێت، وەکوو چۆن شاعیرەکانی تر دەسیان دەکەوێت، پێیان ووت بڕۆ لەشیعرەکانتا هەجوی بنەماڵەی ئەبو تالیب بکەو بەخراپ ناویانبەرە، ئەویش وایکرد وەکو ئەوان ویستیانو دوایی ئەوەی دەستکەوت کە خەونی پێوە دەبینی.

هەر لەسەروەختی عەباسیەکاندا مەئمون ویستوویەتی ناوبژی بکات لەنێوان ئەم دوو خێزانەدا تا ڕێکیان بخات، بەڵام سەرکەوتوو نەبووە. ئەو ویلایەتی عەهدی خۆیدا بەیەکێك لەعەلەویەکان کە

ناوی عەلی بن موسا بوو بەڵام عەباسییەکان لێی ڕاستبوونەوەو ڕاپەرینیان لەدژی کردو ناچاریانکرد بەزووترین کات خۆی ڕزگار بکات لەم کابرایەو قسەوباسیش هەیە کە گوایا ژەهرخواردی کردووە ئیتر ناوبژی و ڕێککەوتنیش لەگەڵ ئەودا مرد.

مەئمون لەگەڵ ئەوەی بەلای عەلەویەکاندا دایدەشکاند، بڕوای وابوو کە عەباس پێشترە لەعەلی بۆ جێگرتنەوەی پەیامبەر، ئەو لەو بارەیە قسەی لەگەڵ عەلی بن موسی دەکردو وشەیان دەگۆڕیەوەو پێی وت: ئەگەر پێتان وایە فاتیمە نزیکی پێغەمبەرە، بەڵام هەق دوای فاتیمە دەگەڕێتەوە بۆ حەسەن و حوسەین کە هەردووکیان زیندوون نەك عەلی.

لەسەروەختی موتەوەکیل دوژمنایەتی نێوان عەباسیەکان و عەلەویەکان گەیشتە ئەوپەڕی، موتەوەکیل چارەی عەلی کوری ئەبو تالیب — ی نەدەویست، ڕقی لێیبوو، هەر موتەوەکیل خۆی فەرمانی دا گۆڕی حوسەین وماڵەکانی دەروپشتی

تێکبدەن‌و نەهێڵن کەس بچێتە زیارەتی، کە بیستی زمانەوانی ئەو کاتە ئیبن ئەلسەکیت چاکەی حەسەن‌و حوسەین دەڵێ‌و بەباش باسیان دەکات، فەرمانیدا زمانی دەرکێشن. دەرچوون نیە لەڕاستی ئەگەر بڵێین کە ئەهلی حەدیس‌و زانا ئاینیەکان (فەقیهەکان) بەشدارییان کردلەو دوژمنایەتیەی کەوتە نێوان هەردوو خێزانی ئەهل ئەلبەیت، کە (بنەماڵەی عەباس) عەباسیەکان خۆیان هەوڵیان دەداو دەیانویست نزیکببنەوە لەوان، بەڵام بێ سوودبوو، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پیاوە ئاینیەکان بەگشتی عەلەویەکانیان بەباشتر دەزانی وەك لەعەباسیەکان، ئەمە لەبەر توندڕەوی تایفی‌و خێڵەکی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو عەباسیەکانیان وەکو ئەمەویەکانی پێش خۆیان سەیر دەکرد لەگەڵ جیاوازیەکی کەم. بەڵام عەلەویەکان شۆڕشگێر بوون‌و نزیکتر بوون لەگیانی ئیسلام وەك لەملکەچکردن‌و چۆکدادان.

مەئمون بەپێچەوانەی موتەوەكیل، خۆی بەستبۆوە بەمەزهەبی موعتەزیلەو فەلسەفەی پێوە دەكردن. موعتەزیلە كۆمەڵە خەلكێك بوون دەیانویست بیروباوەڕی ئاینی لەسەر بنەمای عەقڵو بیركردنەوەی مەنتیقی بنیات بنرێو مەئمونیان بەكاردەهێنا بۆ بلاوكردنەوەی مەزهەبەكەیان لەنێو خەلكیداو هەولێكی زۆریشیان دەدا لەو پێناوەداو هەر كەسێك جیاواز بوایە لەگەلیان دەیانچەوساندەوە.

هەرچی موتەوەكیل ــ ە بەپێچەوانەی موئمونەوە، موعتەزیلەكانی دەچەوساندەوەو بەدوای هەر یەكێكیانەوە بوو، لەپلەوپایە كە پێشتر دەستیان كەوتبوو دووریانی دەخستەوە، یەكێك لەو شتانەی ئەو كردی لەو پێناوەدا، فەرمانیدا بەهاوكارەكانی لەمیسر كە ڕیشی (قاضی القضاة) سەرۆكی دادگا كە لەموعتەزیلەكان بوو، بتاشنو ئەتكی بكەنو بێزاری بكەنو سواری گوێ درێژی بكەنو بەناو بازاردا بیگێڕن.

موتەوەکیل یەکێك بوو لەخەلیفە هەرە زۆردارەکان لەڕووی خوێنڕشتن و سووکایەتی پێکردن و کاری خراپەوە، فەرمانی دەدا بەپیاوە ئاینیەکان کە حەدیسی وا بڵێن کاربکاتە ناخی مرۆڤ لەپێناوی سەرخستنی سوننەو جەماعەت، واتە ژیانەوەی سوننەو مراندنی داهێنان. وای لەوانە کردبوو کە پیایدا هەڵبدەن و بەرز بینرخێنن و لەکارە خراپەکانی خۆش ببن، هەندێك لەمانە دەیانگێڕایەوە کە لەخەویاندا بینیویانە خودا لەکارە خراپەکانی ئەو خۆش بووە. ئەمری دەدا خەڵکی دەست بەرزبکەنەوەو لاسایی بکەنەوە، ئەوەی خەلیفەکانی بەنی عەباس نەیانتوانی سەرکەوتوو بن لەڕاکێشانی ئیمام و فەقیهەکان بەلای خۆیاندا، ئەم توانی بەچەپۆکێك جێبەجێی بکات.

موتەوەکیل سەردەمێکی نوێی دەستپێکرد لەمێژووی ئیسلامدا، دین و دەوڵەت بوون بەیەك سیستەم و ڕژێم، دین لایەنگری دەوڵەتی دەکرد بەقەڵەمەکەی، دەوڵەتیش لایەنگری ئایینی دەکرد بەشمشێرەکەی،

خەڵك دەستیان بەرز دەکردەوەو دووعایان دەخوێندو دەیانگوت: (خوایە ئاین‌و دەوڵەت سەرخەیت).

ڕووداوێکی تری گرنگ هەیە کە بایەخی زۆری هەیە لەگەشەپێدانی بیری ئیسلامیداو نابێ کەم حسابی بۆ بکرێت یاخود لەنرخی کەمبکرێتەوە، کە مێژوونووسەکان لەسنووریکی ئێجگار تەسکدا باسیان لێوە کردووە، ئەویش درێژەدانە بەو ڕێبازەی کە خەلیفە ڕەشیدو مەتەوەکیل لەسەری دەڕۆیشتن. ڕووداوەکە بریتیە لەخەلیفەکانی ئەندەلوس کە هاتنە ناو مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەت‌و پێشبرکێیان دەکرد لە هاندانی فوقەهاو زاناو ئیمام‌و دانەرەکان. ئەمانە هەستیان بەهەڵەی ئەمەوییەکانی پێش خۆیان کردبوو لەشام کە خۆیان دووردەخستنەوە لەو توێژەی کە ناویان هات.

ئەندەلوسیەکان توانیان ئەو توێژە لەخۆیان نزیك بخەنەوەو کتێبەکانیان بەبەرزترین نرخ بکڕن‌و هەندێکیان لەڕۆژهەڵاتەوە بانگەشە بکەن بۆ

ئەنـدەلوس و ئـیتر وای لێهـاتبوو ئەوانـەی ناڕەحـەت دەبوون، لەوێ باریان دەکرد بۆ ئەنـدەلوس و ئـیتر وای لێهـاتبوو ئەوانـەی ناڕەحـەت دەبـوون، لـەوێ باریـان دەکـرد بـۆ ئەنـدەلوس بـۆ ئـەوەی پلـەو پایـەو دەسـتکەوتیان زیـاتر بێـت. ئەندەلوسـیەکان لەباسـی ئاینیـدا لەسـەر ڕێبـازی ئیمامـەکانی وەکـوو ئـەبی حەنیفـەو جەعفـەر بەجەعفـەرەوە نەنوسـێنرێ محەمەدو شافیعی نەدەڕۆشتن و زیاتر دەرویشی ڕێبازی متەوەکیل بوون کە برێتی بوو لە خۆ بەدەستەوەدان و لاسـایی کردنـەوە (التـسلیم و التقلیـد) و ڕێکـەوتی هەرکەسێك لەو جەماعەتەیان بکردایە دەریان دەکرد، خـۆ ئەگـەر لووتیـان بـەلووتی کەسـێکی سـەر بەموعتەزیلـەوە ببوایـە ئـەوا دەیانکوشـت. جگەلـەوە ئەندەلوسـیەکان بەشـانوباڵی خێزانـی ئەمەویەکانـدا هەڵیاندەداو بەلای عەلی و ئەولادەکانیدا نەدەچوون.

ئـەم ڕێبـازە نوێیـەی ئەندەلوسـیەکان کـە بەخۆشویستنی ئەمەوییـەکان نـاوزەرد دەکرێـت وردە

وردە جێی خۆی کردەوە لەناوەندی زانستی ڕۆژهەڵاتدا. هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی ناوی معاویە بچێتە دڵی ئەهلی سوننەو جەماعەت لەڕۆژهەڵات، لای ئەوان معاویە لەهاوەڵەکانی پەیامبەر بوو، وەحیەکانی ئەوی دەنووسیەوە.

ئەوەی سەرەنج رادەکێشێ ئەوەیە کە زۆربەی فارسەکان لەوکاتەدا سەر بەئەهلی سوننەو جەماعەت بوون و ئەسفەهان ناوەندی ئەوان بوو، بەڵام ئەهلی عێراق کە زۆربەیان شیعە بوون لەناوچەی کوفە خڕ بووبوونەوە. لەبەغداش خەڵکانێك هەبوون، سەر بەملا یا ئەولا بوون، شارەکە بووبوە هێلانەیەك بۆ فیتنە لەنێوان سوننەو شیعەدا، ئاژاوەو فیتنە لەنێوان ئەم دوو تایەفەیە هەتا دەهات ڕووی لەزیادبوون بوو، ساڵێك نەبوو بەغدا ئارامی بەخۆیەوە ببینێ، ناکۆکیەکانی نێوان ئەم دوولایە شێوەی توندوتیژی بەخۆوە گرتبوو، هەر لایەك توندڕەوی دەنواند بەرامبەر بەلایەکەی ترو دژایەتی یەکتریان دەکرد.

دەتوانرێت بوترێت ناکۆکی نێوان شیعەو سوننە شێوەی سەرگەرم بوونو لەخۆبایبوونی هاوەڵەکانو بنەماڵەی پەیامبەری (عەباس، فاتیمە، عەلی) بەخۆوە گرتبوو، سوننەکان سەرگەرمی هاوەڵەکانی پەیامبەر بوون، شیعەکانیش سەرگەرمی بنەماڵە بوونو ئیتر هەر لایە خۆی هەڵدەکێشا بەسەر لایەکەی تردا. حەدیسێکی پەیامبەر هەیە کە ئەهلی سوننە خۆیان پێوە بەستبۆوە: (هاوەڵەکانم وەکو ئەستێرەی ئاسمان وەهان، کامەیان بگری رێپیشاندەرن، جیاوازی هاوەڵەکانیشم بەزەیی خودایە) لەولاشەوە شیعەکان بەوتەیەکی تری پەیامبەرەوە خۆیان بەستبۆوە: (ئەهلی بەیت وەکوو کەشتیەکەی نووح وایە، هەرچی سواری بوو رزگاری بوو، هەرچیش دواکەوت خنکا). سوننە چاکەیان لەهاوەڵەکانی پەیامبەردا دەبینیەوە، شیعەش لەوەی کێ عەلەوی بێت. سوننە شیعەیان بەکەللە رەق دەزانی بەوەی هاوەڵەکانی پەیامبەر رەتدەکەنەوە، ئەمانیش سوننەیان بەوە تاوانباردەکرد

که دوژمنایەتی ئەهلی بەیت دەکەنو دەست دەخەنە دەستی ئەمەویە دوژمنەکانیان. ئەم ناوناتۆرەیە بووە دەردێکی کۆمەڵایەتی کە هەرهەمووی لەکەڵەکەبوونی فیکریەوە دروستبوو.

لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا بوەیهییەکان هاتنە بەغداو هەموو شیعە بوون، خەلیفەکانی بەنی عەباس هەموو ئەهلی سوننە بوون، بەم شێوەیە دوو تایەفەی دەسەڵاتدار لەشاری بەغدا پەیدا بوون، خەلیفە سونییەکانو ئەمیرە شیعەکان، ناودارەکانی ئەوکاتەی بەغداش دوو جۆر بوون، عەلەویەکانو عەباسیەکان کە هەریەکەیان سەرگەرمی تایەفەکەی خۆی بوو، لەبەرئەوەی ئاژاوەو پشێویو خوێنڕشتنو دەستدرێژیکردنە سەر ژنان زۆر بوو بوو. ئەهلی سوننە کە بڕوایان بەخەلافەت هەبوو لایەنگری عەباسیەکانیان دەکردو بەسێبەری خودایان دەزانین لەسەر زەوی. شیعەکان بڕوایان بەئیمامەت هەبوو کە لەبنەماڵەی عەلی دا دەیانبینیەوەو لێی دەرنەدەچوون.

ئــەم دوو تایفەیــە (عەباســیەکان و عەلەویــەکان) ســەرگەرمیی و حەماســەتی خــەڵکی بەغــدادیان بــۆ مەبەستی شەخسی خۆیان بەکاردەهێنا و دەیانهەژانن. ئیتر کارەکە لەوە دەرچوو کە شەڕو مشتومڕەکانیان لەسەر بیروباوەڕ بێت، شەڕی ئەمانە، شەڕ بوو لەسەر سەرۆکایەتی.

ناکۆکیــە تایفییــەکانی نێــوان ســوننەو شــیعە شــێوەیەکی تونــدی بــەخۆوە گرتنبــوو لــەکاتی ناکۆکیەکانی نێوان عوسمانیەکان و سەفەویەکان لەسەر عێراق بەمەرجێك عێـراق خـۆی سەرچاوەی ئـەم ناکۆکیــە بــوو لەســەرەتاداو دوایــی بــوو بەناوەنــدی ململانێــی نێــوان دوو دەوڵــەتی شــیعەو ســوننە. ســەفەویەکان ڕۆڵێکــی گرنگیــان دەگێــرا لەمێــژووی شیعەچــێتیداو توانیــان خەســڵەتە شۆڕشــگێڕیەکە لەشیعە داماڵن و بیکەنە مەزهەبێکی ڕەسمی کە هیچ جیاوازییەکی نەبێ لەگەڵ مەزهەبە ئاینییەکانی تردا. فارســەکان پــێش دەرکــەوتنی ســەفەویەکان ئــەهلی

سوننەو جەماعەت بوون، بزوتنەوەی عەباسیەکان لەناو فارسەکاندا پەیدا بوو، بەسەرپەرشتیو هەوڵو کۆششی ئەوانیش گەشەی کرد.

ئیمامو پیاوە ئاینیو زاناکانی ئەو سەردەمە هەموو فارس بوون وەکو: نیسابوری، بوخاری، تەرمەزی، رازی، تەبەری، غەزالی، خۆراسانی، شەهرستانی، گەیلانی، ئوسترابادی، خوارەزمی، جرجانی، ئەمەدی، ئەسفەهانی، تەستری،.... .

فارسەکان هەر هەلگری ئالآی سەفەوی بوون پێش دەوڵەتی ئەمەوی دەربکەوێت، سەفەویەکان هەموو ڕێگەیەکیان گرتەبەر سەبارەت بەناچارکردنی فارسەکانو ڕاکێشانیان بۆ سەر مەزهەبی شیعە، پەنایان دەبردە بەر چەوساندنەوەو ئازاردانو کوشتنو بڕین لەم پێناوەدا، درووشمی ئەوان لەمەدا (یاعلی) بوو، ئەمەی ئەمان کردیان بەرامبەر بەفارسەکان، هەمان شت بوو کە ئەیوبییەکان لەمیسر کردیان دژی دەوڵەتی فاتمی. شیعە لەسەروەختی سەفەویەکاندا

بووە مەزهەبێکی نەتەوەیی لەئێران، کە دواتر ڕەنگی لووتبەرزی و لەخۆبایبوونی نەتەوەییان تێهەڵسوو تا لەدواجاردا بوو بەبیروباوەڕی دەسەڵاتداران. سەفەویەکان بۆ پڕوپاگەندەکردن پەنایان بردبوە بەر کۆمەڵێ دەرویش کە خۆیان بەشیعرو قسەی بریقەدار لەهەموو شوێنێکی وڵاتدا بەشان و باڵی ئەواندا هەڵیان دەداو هاواریان دەکرد یا عەلی، بەم شێوەیە هەروەکو چۆن پێشتر بەناوی خواو پێغەمبەرەوە کاریان بۆ بیرەباوەڕو مەزهەبی خۆیان دەکرد، بەهەمان شێوە عەلییان کردبوو بەچەکێك بەدەست خۆیانەوە. دەسەڵاتدارانی سەفەوی و عوسمانی لەبنەڕەتدا جیاواز نەبوون لەیەك، هەردوولا خواپەرستیان دەکردو خواپەرستیشیان بەکاردەهێنا بۆ بەرژەوەندی خۆیان، چالاکییەکانی ئەمانە هاتبوە سەر دروستکردنی مزگەوت و رازانەوەی دیوارەکانی و لەئاڵتوونهەڵکێشانی منارەکانی. بۆ نمونە ئیمامی ئەعزەم لەکەناری لای چەپی ڕوباری دیجلە نێژراوەو ئیمام کازمیش لەکەناری

لای ڕاست، خەڵکانی هەردوو گەڕەکی کازمیەو ئەعزەمیە بەمبەرو بەوبەری ڕوبارەکەوەن کە خەریکی جنێودان‌و سووکایەتیکردنی یەکتر بوون، بەمەرجێك هەردوو ئیمامەکە سەر بەیەك حزبن چونکە دژی دەسەڵاتداران بوون. دەگێڕنەوە ناسرەدین شا (شاهی ئێران) لەساڵی ١٨٧٠دا زیارەتی مەرقەدی ئیمام حوسەینی کردووەو لیی پاڕاوەتەوەو بەدەوریدا گریاوەو فرمێسکی بۆ هەڵڕشتووە هەتا چاوەکانی هیلاك بوون، هاروون ئەلرەشید - یش هەمان شیوەن‌و گریانی کردووە، کەچی هەردوولایان خوێنڕێژو چەوسێنەرو ڕەوشت نزم بوون.

بناغەکانی (الاصول) شیعە بوون کە پاشماوەی سەردەمێکی کۆنی بەسەرچوون لەم خاڵانەدا کۆبەند دەبێت.

## یەکەم

**بڕواهێنــــان بەئیمامــەت:** شــیعەکان بەچــاوی ڕێزوحوورمەتــەوە ســەیری ئیمامــەکانی خۆیــان دەکــەن کــە دەیانگێڕنــەوە بــۆ ئــەولادەکانی عــەلی‌و لای ئــەوان ئەمانە هەڵەیان نەکردووەو بێ گوناەو بێ خەتان بۆیە بــەرزیان دەکەنــەوە بــۆ ئاســتێکی بــەرزتر لەمــەردم‌و پەنادەبەنــە بــەر مەرقــەدەکانیان‌و داوای شــفاعەت‌و لێخۆشــبوونیان لێدەکــەن بەرامبــەر بەخــەتاو گوناهەکانیان. ئەم زێدەڕۆییە لەپیرۆزی‌و بــەرزڕاگرتنی ئیمامەکان لەسەرەتاوە بیروباوەرێکی شۆڕشگێرانە بــوو کــە دوایــی ڕووت بــووەوە لــە خەسڵەتی شۆڕشگێڕانە‌و بوو بەبیروباوەڕێکی بــەتاڵ لــە گیــان. مەبدەئی پــاکیی، مانایەکی کۆمەڵایەتی هەیە کــە بریتیە لەڕەخنەیــەکی ناڕاســتەوخۆ لەگەنــدەڵیی‌و نزمیــی دەســەڵاتدارانی ئیسلام. شیعە سەرەتاییەکان لەوانەی بڕوایان بــەپاکیی

ئیمامەکان هەبوو، بەرەنگاری خەتاو تاوانەکانی دەسەڵاتداران دەبوونەوە. ئەمە لەوەی ئیفلاتون و فارابی و گەلێکی تر لەفەیلەسووفەکان دەچوو بۆ چاکسازی لەکۆمەڵدا، ئەو دوانە بڕوایان وابوو کە چاکسازی لەکۆمەڵدا دەبێ بکەوێتە ئەستۆی فەیلەسووفێکی پاك و ڕەوشتبەرز.

## دووەم

(عەقیدەی) بڕواهێنان بەمەهدی یە، هەر ئەم بڕوایە بناغەیەکە شۆڕشی زۆری لەسەر بەرپا کراوە لەسەردەمە کۆنەکاندا. مەهدی بەمانا کۆمەڵایەتیەکەی مانای شۆڕشگێڕە، ئەو کەسەی خوا هیدایەتی داوە بۆ هەق، بۆ چاکەکردن. لێکۆڵەرو و مێژوونووسەکان سەریان لەوە دەرناچێ کێ یەکەمجار لەمێژووی ئیسلامدا زاراوەی مەهدی بەکار بردووە، هەندێك

پێیان وایە لەئەلمەسیح وەرگیراوە کە لەتەوراتدا هەیەو دوایی تەعریب کراوە. مەسیحیش بەو کەسە دەڵێن کە خوا هیدایەتی داوەو لایەنگری خۆی ناردوە بۆ ئەو کەسە کە مانای (مەمسوح)ە.

تەورات باس لەمەسموح دەکات کە خوا دەینێرێ بۆ مۆژدەپێدان بەخەڵکی هەژار، ئەمەی لەتەوراتدا هاتووە نزیکە لەوەی شیعەکان بڕوایان پێیەتی دەربارەی (مەهدی).

هیواو ئاواتو خەونی چەوساوەکان لەهەموو کاتو شوێنێکدا وەکو یەکن، ئەوەی زوڵمی لێدەکرێو ناتوانێ تۆڵەی خۆی بسەنێتەوە، پەنا دەباتە بەر بڕواو ئیمانو بیروباوەڕی خۆی، لەناو ئەوانەش بڕواهێنان بەئەفسانەو خەیاڵو بیرکردنەوەی بێسەرو شوێنو بەو پێیە کۆشکێك لەخەیاڵو هیوا بۆ خۆی دروستدەکات.

## سێیەم

بریتیە لە سوننەتی (التقیة)، واتە خۆبەدەستەوەنەدان، خۆپاراستن، پێداگرتن، کە خۆی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، لە سەرەتاوە لەگەڵ جووڵانەوەی شۆڕشدا دەڕۆیشت. شیعە کۆنەکان پەنایان دەبردە بەری بۆئەوەی تەنگ بەدەوڵەت هەڵچنن. مامۆستا موسی جارالله دەڵێ: تەقییە لەئایندا جیاوازی نیە لەگەڵ (نێوان تێکدان). شەڕکەرێك (موجاهید) لەڕێی ئایندا دەڵێ: تەقییە راستو درووست بوو لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامدا، ئەو کاتەی قورەیشییەکان موسڵمانەکانیان دەچەوساندەوە. بەڵام دوای ئەوەی دەوڵەتی ئیسلام بەهێز بوو ئەوا تەقییە درووست نییە. بەهەرحاڵ لەم چەرخەدا تەقییە خەسڵەتی شۆڕشگێرانەی خۆی ونکردووەو بەسەریش

چووە، شیعەکانیش ئێستا شتێکی ئەوتۆ لەسەر شۆڕش نازانن.

## چوارەم

(عـزاء الحسین) واتـە پرسـەو شیوەن‌و گریـان بـۆ گیانی حوسەین کـە لەسەرەتادا دروشمێـك بـوو بـەرز دەکرایـەوە بـۆ پڕوپاگانـدەکردن‌و تۆڵەسـەندنەوە لەدەوڵـەت‌و وای لێهات بەتێپـەڕبوونی رۆژگـار ببێتـە چەند بۆنەیەکی ئاینی کە هیچ مانایان نییە.

کـۆن شـیعەکان لـەژێر زەمینـدا کۆدەبوونـەوە بـۆ بەسەرکردنەوەی ئەم رۆژە رەشەی خۆیان‌و لەوێ لـەناو خۆیانـدا باسی حوسەین‌و ئـەو زوڵـم‌و زۆرە دەکـرا کـە لێـی کرابـوو، هـەروەها باسـی چەوساندنەوەی خۆیـان دەکـرد کـە دەوڵـەت لەهـەموو قۆناغەکانـدا پـەنای دەبردەبەر.

وەرزی زیـارەتو دیـدەنی لەکەربـەلا وەکـوو وەرزی چوون بۆ حەج وایە لەرووی زۆری خەڵکەوە کە زوو زوو بۆی دەچن، بەڵام دیدەنیەکەی شیعەکان لەهەنـدێ رووەوە جیاوازە وەك لەحەج چونکە لەناخیانـدا تـۆوی شۆڕشێکی دامرکاویان پێیە، ئەوەی ئەم دیمەنـە ببینـێ لەکەربەلا هەست بەمەترسیەکی شاراوە دەکات.

موتـەوەکیل رۆژی خـۆی هەوڵیـدا ئـەم مەترسـیە نـەهێڵێ، مەرقـەدی ئیمـام حوسـەینی رووخانـدو زەویەکەی کێڵا و ئاوی کـردە سـەر. کەچی سەرکەوتنی تەواوی بەدەست نـەهێنا، خـەڵکی بـەنهێنی دەهاتن بـۆ زیـارەتو لـەو پێناوەشدا نەفـەس درێـژ بـوون، گـۆڕی حوسەین مایەوە لەگەڵ ئەم هەموو دەست درێژییـەداو خـەڵکیش تینوێتیـان نەشـکاوە. پێـشتر شـیعە خوازەکانمان شوبهاند بـەکێوێکی ئـاگر پـژێنی (برکـان) دامرکاوەو رۆژێك لەرۆژان وەهابوونو وردە وردە بوونە کێوێك کە تەنها نـەختێك دووکـەڵی لێبـەرز دەبێتـەوە. کێـوی ئـاگر پـژێنی دامرکـاو بـەتاڵ نیـە لەمەترسـی

چونکە لەناوەوەی خۆیدا ئاگری تێدایە، بەڵام کەس نازانێ کەی جارێکیتر دەتەقێتەوە.

ئیمام پەرستەکان ئەوەی هەموو شیعە بڕوایانی پێهێناوە وا هەڵکەوتوون کە دەست لەرەخنەگرتن لەفەرمانڕەوایان هەڵنەگرن و وەکوو ئۆپۆزسیۆن لەبەرامبەریاندا راوەستنەوە بەدرێژایی مێژوو، ئەوان بڕوایان وایە کە حکوومەت ناسنامەی سیاسی هەرچییەك بێ هەر چەوسێنەرو زاڵمن و ئەو کاتە دەست هەڵدەگرن کە ئیمامێکی سەر بەبنەماڵەی عەلی دەسەلات بگرێتە دەست.

ئەو بەرنامەیەی ئەوان پێیانە بۆ رژێمی حوکم نموونەیەکی زۆر بێ وێنەیەو لەخەیاڵو خەو دەچێت نەك واقیع، بۆیە هەمیشە لەیاخیبونێکی بەردەوامدا بوون، پێوانەو هەڵسەنگاندنی ئەمان بۆ ئیمام و ئیمامەت چۆنە، هەمان شتیان دەوێت بۆ فەرمانڕەواو دەسەلاتداران.

ئیمامو زاناکانی شیعە هیچ شتێکی حکوومەتیان قەبووڵ نیەو بۆ بژێوی خۆیان پشت بەسەرچاوەی خەڵکی سەر بەخۆیان دەبەستن، تەنانەت شیعە زاناکانی ئێرانیش یارمەتی لەمیللەتەوە وەردەگرنو هیچی حکومەتی ئێرانیان قەبووڵ نیە بەمەرجێك حوکم لەئێراندا بەدەست شیعەوەیە. ئەم توێژە ئەگەر هاتوچۆی دەزگاو دایەرەکانی حکومەت بکەن ئەوا لەبەر چاوی خەڵك سووكو بێ نرخ دەبنو بەسیخوڕ (جاسوس) ناویان دەبەن. نەفرەتکردن لەحکومەت لەلایەن شیعەوە بۆتە گرێیەکی نەفسی، زۆر زەحمەتە بۆ زانا شیعەکان لەحکومەت نزیك ببنەوە لەو کاتەدا کە ئەوان مەبەستیانە ڕێزو حورمەتیان لای خەڵکی بمێنێ. ناشیرینترین تۆمەت کە بخرێتە پاڵ شیعەکان ئەوەیە کە پێیان بڵێن موچە لەحکومەت وەردگرن.

زانا شیعەکان شانازی دەکەن بەوەی دەرگای کۆششکردنو خۆهیلاککردنو خۆبەختکردن لای ئەوان کراوەیە، بەڵام لەڕاستیدا سوودیان لێوەرنەگرتووە.

ئەوان لەپەیداکردنی رزقی خۆیاندا پشت بەخەڵکی دەبەستن، خەڵکیش حەزیان بە نۆیکردنەوەی ئەو داب و نەریت و بیرو باوەڕانە نیە کە لەباب و باپیریانەوە بۆیان جێماوە. کۆششکەرێکی شیعی هەقی دراوەتێ نوێکردنەوە بکات لەشەریعەتدا بەڵام نایکات چونکە دەترسێت خەڵکی لێ راست ببێتەوەو نان بڕاو بێت.

شیعەکان میراتگری موعتەزیلەن لەبیری فەلسەفەو ئازادی بیرکردنەوە، ئەوەی کتێبەکانی شیعە دەربارەی بناغەکان (الاصول) بخوێنێتەوە، فەلسەفەی موعتەزیلەی بەئاشکرا تێدا دەبینێتەوە.

کێشەیەکی تری شیعە ئەوەیە کە زاناکان لەنێوان خۆیاندا گفتوگۆ دەکەن و زانیاری دەگۆڕنەوە بەڵام لەبەردەمی خەڵکیدا ئەو کارە ناکەن، لەبەر ئەوەی دیوی ناوەوەیان تێکۆشانە بەڵام دیوی دەرەوەیان لاسایی کردنەوەیە. بەدەگمەن شیعەیەکی خۆبەختکەر دەبینی کە بیری ئازادی خۆی دەربڕێ لای خەڵکی. ئەم خۆبەستنەوەیەی ئەوان بەزۆربەی خەڵکەوە وای

لێکـردوون پـشتگیری لەشۆڕشـەکانی ئـەوان بکـەن دژی
دەسەڵاتداران.

